# (ده) ئامۆژگاری
# بۆ خۆپاراستن
# له نهخۆشییه درمهکان

نوسینی: عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر
وهرگێڕانی: حهمزه بهرزنجی

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكی

هەموو حەمدو ستایشێك بۆ خوای گەورەیە، وەلأمی هەموو پێگیراوێك دەداتەوە كاتێ لێی دەپاڕێتەوە، وە بە فریای داماوو لێقەوماوە دەچێت كاتێ بانگی لێ دەكات، ناڕەحەتی لا دەبات و خەم و ناخۆشییەكان دەڕەوێنێتەوە، دڵەكان زیندوو نابنەوە بە غەیری زیكری ئەو، هیچ شتێك ڕوو نادات بەبێ ئیزنی ئەو، كەسیش ڕزگاری نابێت لە هیچ ناڕەحەتییەك تەنها بە بەزەیی ئەو نەبێت، هیچ شتێك پارێزراو نابێت بە پارێزگاری ئەو نەبێت، كەس بە ئومێدی خۆی ناگات تەنها بە ئاسانكاری ئەو نەبێت، كەس

ناگات به بەختەوەری تەنها به گوێڕایەڵی ئەو نەبێت.

شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (اللّه)، تەنهایەو هیچ هاوبەشێکی نییە، پەروەردگاری جیهانیان و پەرستراوی یەکەمین و دواهەمییان و هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەوییەکانە.

وە شایەتی ئەدەم کە محمد بەندەو نێردراوی ئەوە، بە کیتابێکی ڕۆشن و ڕێگایەکی ڕاستەوە نێردراوە، صەڵات و سەلام لەسەر خۆی و خانەوادەو هاوەڵانی سەراپا.

**صلّى اللّه وسلم عليه، وعلى آله وصحبه أجمعين.**

## پاشان:

ئەمە چەند ئامۆژگارییەکی بەسوودە کە لێرەدا دەیخەمە ڕوو بە بۆنەی ترسی خەڵکییەوە لەم چەند ڕۆژانەدا لەو درم و نەخۆشییەی ناسراوە بە (کۆرونا).

لە خوای گەورە داواکارم هەموو نارەحەتی و بەلاّیەك هەڵبگرێت لەسەر خۆمان و موسڵمانان لەهەر کوێیەکدان، وە نەخۆشی و ئازارمان لەسەر لاببات، وە هەموومان بپارێزێت بەوەی بەندە صاڵحەکانی خۆی پێ دەپارێزێت، هەر ئەو سەرپەرشتیارو تواناداره بەسەر ئەمەدا:

## ١- ئەووەی پێش دابەزینی بەڵاو تاقی کردنەوە دەوترێت:

عن عثمانَ بنِ عفَّانَ (رضي الله عنه) قال: سَمِعْتُ رسولَ اللَّهِ(ﷺ) يقولُ: «مَنْ قالَ: (بِسْمِ اللَّهِ الذي لا يَـضُرُّ مع اسْمِهِ شَيءٌ في الأرضِ ولا في السَّماءِ وهُوَ السَّميعُ العَليمُ) ثلاثَ مَرَّاتٍ لمْ تُصِبْـهُ فَجْأَةُ بلاءٍ حَتَّى يُصْبِحَ، ومَنْ قالها حِينَ يُصْبِحُ ثلاثَ مَرَّاتٍ لَمْ تُصِبهُ فَجْأَةُ بلاءٍ حَتَّى يُمْسِيَ». رواه أبو داود وغيره.

واته: هەرکەسێك سێ جار بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ الذي لا يَـضُرُّ مع اسْمِهِ شَيءٌ في الأرضِ ولا في السَّماءِ وهُوَ السَّميعُ العَليمُ) واته: (خۆم پەنا ئەدەم) بە ناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیانی پێ ناگات (یان زیان ناگەیەنێ)

نه له زەوی و نه له ئاسماندا ئەو خوایه بیسەره بە ووتەی بەندەکانی و زانایه بە کرداریان.

ئەوا هیچ بەلأیەکی له ناکاوی تووش نابێت هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە، وە هەرکەسێکیش بەیانیان سێ جار بیلێت هیچ بەلأیەکی له ناکاوی تووش نابێت هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە.

## ٢- زۆر ووتنی (لاإله إلا أنت سُبحانكَ إنِّي كُنتُ من الظّالمين):

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ

الظَّالِمِينَ ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾. الأنبياء:٨٨

واته: وه(باسی) زەننون (یونس(علیه السلام) بکە کە پیغەمبەری خەلکی نەینەوا بوو) کاتی رۆشت بە تورەیی (گەلەکەی بەجێ هێشت) وای دەزانی ئیمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین، جا لە تاریکیەکاندا (تاریکی شەو و دەریا و ناوسکی نەهەنگ) هاواری کرد (ئەی خوایە) بەراستی هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، پاکی و بێ نوقسانی بۆ تۆیە بیگومان من لە ستەمکاران بووم، ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیراکرد و لەو غەم و خەفەتە رزگارمان کرد هەرواش ئیمانداران رزگار دەکەین.

الحافظ ابن كثير(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە تەفسیری: ﴿وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾، دەفەرموێت: (أي: إذا كانوا في الشدائِدِ ودعونا مُنيبين إلينا، ولا سيَّما إذا دَعَوا بهذا الدعاءِ في حالِ البلاء).

واتە: هەروەها ئیمانداران ڕزگار دەكەین ئەگەر لە ناڕەحەتیدا بن و بە پەشیمانییەوە لێمان بپاڕێنەوە، بە تایبەت ئەگەر لە كاتی بەڵاكەدا بەم نزایە بپاڕێنەوە).

پاشان فەرموودەیەك دێنێت لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) كە فەرموویەتی: ((دعوةُ ذي النُّون إذْ دَعا بها وهو في بَطْنِ الحُوتِ: (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنتُ من الظالمينَ)، لَم يَدْعُ بها رجلٌ في شيءٍ قطُّ إلا استجابَ اللهُ له)). أخرجه الإمام أحمد والترمذي.

واتە: پاڕانەوەو نزاكەی یونس پێغەمبەر(علیه السلام) كاتێ لە سكی حوتەكەدا بوو پاڕایەوە پێی بریتی بوو لە: (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنتُ من الظالمينَ).

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لە تۆ، خوایە پاكیو بێ نوقسانی بۆ تۆیە، بە ڕاستی من لە ستەمكارانمو ستەمم لە نەفسی خۆم كردووە.

هیچ كەسێك نییە كە بەو دوعایە بپاڕێتەوە بۆ هەر شتێك ئیلا خوای گەورە وەلاَمی دەداتەوە.

زانای پایەبەرز ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە كتێبی(الفوائد)دا فەرمویەتی:

(فما دُفِعَتْ شدائِد الدُّنيا بِمثل التَّوْحِيد، ولذلك كان دُعاء الكَرْبِ بِالتَّوحِيدِ، ودعوةُ ذِي النُّون التي ما دعا بها مَكْرُوب إِلَّا فَرَّج الله كَرْبَهُ بِالتَّوْحِيدِ.

فلا يُلْقِي فِي الكُرَبِ العِظام إِلَّا الشِّرك، ولا يُنْجِي مِنها إِلَّا التَّوْحِيد، فَهُوَ مَفْزَعُ الخَلِيقةِ ومَلْجَؤُها وحِصْنُها وغِياثُها، وباللَّهِ التَّوْفِيق).

واته: نارەحەتییەکانی دونیا پاڵی پێوە نەنراوەو دوور نەخراوەتەوە بە هیچ شتێك هاووێنەی (التوحید) تەنها الله پەرستی بێت، هەر بۆیە پاڕانەوەی کاتی زۆر نارەحەتی بە تەوحیدە، وە پاڕانەوەکەی یونس پێغەمبەر(علیه السلام) کە ئەگەر هەر کەسێك پێی بپاڕێتەوە وەڵاَم دەدرێتەوە هەر بە تەوحیدە.

هیچ شتێك وەك شیرك مرۆڤ ناخاتە ناو نارەحەتی گەورەوە، وە هیچ شتێك جگە لە تەوحید ڕزگاری ناکات، چونکە تەوحید فریاد ڕەس و پارێزەرو قەڵای دروست کراوانە.

## ٣- پەنا گرتن بە خوا لە بەڵای قورس:

عن أبِي هُرَيرَةَ (رضي الله عنه): ((**كان رَسُولُ اللّهِ(ﷺ) يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ البلاءِ، ودَرَكِ الشَّقاءِ، وَسُوءِ القضاءِ، وشَماتَةِ الأعدَاءِ**)).

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر جار پەنای ئەگرت بە خوای گەورە لە بەڵای قورس و شەقاوەت بوون و قەزای ناخۆش و دڵخۆش بوونی دوژمنان.

وعن أبي هُرَيرَةَ (رضي الله عنه) عن النَّبِيِّ(ﷺ) قَالَ: «**تَعَوَّذُوا بِاللّٰهِ مِنْ جَهْدِ البَلاءِ، ودَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ القَضَاءِ، وشَمَاتَةِ الأعداءِ**». رواهما البخاري.

واته: پەنا بگرن بە خوای گەورە لە بەڵای قورس و شەقاوەت بوون و قەزای ناخۆش و دڵخۆش بوونی دوژمنان.

## ٤- پارێزگاری کردن لە ووتنی نزای چوونە دەرەوە لە ماڵ:

عن أنس بنِ مالكٍ (رضي الله عنه) أنَّ النَّبِيَّ(ﷺ) قال: «**إذا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فقالَ: «بِسْمِ اللّٰهِ، تَوكَّلْتُ على اللّٰهِ، لا حولَ ولا قُوَّةَ إلا بِاللّٰهِ»–قال– : يُقالُ حِينَئِذٍ: هُدِيتَ، وكُفِيتَ، وَوُقِيتَ، فتَتَنَحَّى**

لَهُ الشَّيَاطِينُ، فَيقُولُ لَهُ شيطانٌ آخَرُ: كيفَ لك بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وكُفِيَ ووُقِيَ؟)). رواه أبو داود.

واته: ئەگەر مرۆڤ لە ماڵ بچێتە دەرەوە بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ، تَوكَّلْتُ على اللَّهِ، لا حوْلَ ولا قُوَّةَ إِلا بِاللَّهِ).

واته: (خۆم پەنا ئەدەم)بە ناوی خوا، پشتم بەخوای گەورە بەست (وە هەموو کارەکانم تەسلیمی ئەو کرد)، هیچ گۆڕان و توانایەك نییە مەگەر بەخوای گەورەوە.

لەو کاتەدا (لە لایەن خوای گەورەوە یان مەلائیکەتەوە) پێی دەوترێت: هیدایەت درایت (بۆ سەر ڕێگای حەق و ڕاست) و کیفایەت کرایت (و دوورخرایتەوە لە خراپە و خەمی دونیاو

قیامەت)و پارێزرایت (لە شتە پەنهان و خراپەکان و دوژمنەکانت لە شەیتانەکان و غەیری ئەوان)، ئیتر شەیتانەکان لێی دوور دەکەونەوە، شەیتانێکی تریش پێی دەڵێت: تۆ چ دەستەڵاتێکت هەیە بەسەر کەسێکدا کە ڕێنمونی کرابێت و کیفایەت درابێت و پارێزرابێت؟

## ٥-داوای پارێزراوی کردن لە خوای گەورە لە بەیانیان و ئێواراندا :

عن عبدِ اللهِ بن عُمَرَ (رضي الله عنهما) قال: «لَمْ يَـكُنْ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) يَدَعُ هَؤُلاءِ الدَّعواتِ حِينَ يُصْبِحُ وحِين يُمْسِي: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العافِيَـةَ فـي الدُّنيا والآخِرَةِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ والعافِيَـةَ فـي

دِيني ودُنْـيايَ وأَهْلِي ومالِي، اللَّهُمَّ اسْتُـرْ عَوْراتِي، وآمِنْ رَوْعاتِي، اللَّهُمَّ احْفَظْنِـي مِنْ بَـيْنِ يَدَيَّ، ومِنْ خَلْفِي، وعَنْ يَمِيـنِـي، وعَنْ شِمالِي، ومِنْ فَوْقِي، وأَعُوذُ بِعَظَمَـتِكَ أَنْ أُغْتالَ مِنْ تَحْتِـي)). رواه أحمد وغيره.

واته: هیچ کات پێغەمبەری خوا(ﷺ) وازی لە ووتنی ئەم نزایانە نەدەهێنا کاتێ بەیانی لێ دەبوویەوەو کاتێ ئێواری لێ دەبوویەوە، دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العافِيَـةَ فـي الدُّنيا والآخِرَةِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ والعافِيَـةَ فـي دِيني ودُنْـيايَ وأَهْلِي ومالِي، اللَّهُمَّ اسْتُـرْ عَوْراتِي، وآمِنْ رَوْعاتِي، اللَّهُمَّ احْفَظْنِـي مِنْ بَـيْنِ يَدَيَّ، ومِنْ خَلْفِي،

**وعَنْ يَمِيـنِـي، وعَنْ شِمالِي، ومِنْ فَوْقِي، وأَعُوذُ بِعَظَمَـتِكَ أَنْ أُغْتالَ مِنْ تَحْتِـي)**

**واتە: خوایە من داوای پارێزراویت لێ دەکەم لە نەخۆشی و بەلاّ لە دنیاو دوارِۆژدا، خوایە داوای لێ بووردن و پارێزراویت لێ دەکەم لە دین و دنیاو کەسوکارو سەروەت و سامانمدا، خوایە عەیبەکانم داپۆشەو ترسەکانم مەهێڵە کە نارِەحەتم ئەکات، خوایە بمپارێزە لەوەی کە (بەهۆی غافڵ بوونمەوە) لە بەردەممەوەو لە دوامەوەو لە راستم و چەپم و سەرەوەم تووشی بەلاّو سزا ببم، وەپەنا ئەگرم بە گەورەیی تۆ کە لە ژێرەوە سزا بدرێم و پێ بکرێم و رِۆبچم بە زەویدا.**

## ٦- زۆر پاڕانەوە:

عن ابنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قال: قال رسولُ اللهِ(ﷺ): ((**مَنْ فُـتِـحَ له مِنـكُمْ بابُ الدُّعاءِ فُـتِحَتْ لـه أبـوابُ الرَّحْمَةِ، وما سُئِـلَ اللَّهُ شَيْـئًا – يعني: أَحَبَّ إِلَيـهِ – مِن أَنْ يُسْأَلَ العافِـيَـةَ**)).

واتە: هەركەسێك لە ئێوە دەرگای پاڕانەوەی لێ بكرێتەوە ئەوە دەرگاكانی ڕەحمەتی لێ كراوەتەوە، هیچ شتێك لە خوای گەورە داوا نەكراوە بەلایەوە خۆشەویست تر بووبێت لەوەی داوای پارێزراوی لێ بكرێت.

وقالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ): ((**إِنَّ الدُّعاءَ يَـنْـفَعُ مِمَّا نَـزَلَ ومِمَّا لَمْ يَنْزِلْ، فَـعَلَـيكُم عِبادَ اللهِ بالدُّعاءِ**)). رواه الترمذي وغيره.

واتە: پاڕانەوە سوودی هەیە بۆ ئەو بەڵایانەی دابەزیوەو ئەوەشی دانەبەزیوە، دە سا ئەی بەندەکانی خوا زۆر بپاڕێنەوە.

## ٧- خۆ بەدوور گرتن لەو جێگایانەی درمەکەی تیایە:

عن عبد الله بن عامر (رضي الله عنهما): ‹**أَنَّ عُمَرَ رضي الله عنه خَرَجَ إلى الشامِ، فلمَّا كان بِسَرْغَ بَـلَغَهُ أَنَّ الوباءَ قد وَقَعَ بالشامِ، فأخبـرَهُ عبدُ الرحمن ابن عَوف: أَنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: «إِذا سَمِعْتُم به بأَرْضٍ فلا تَـقْدَمُوا عليه، وإذا وَقَعَ بأَرضٍ وأنتُم بها، فلا تَخْرُجوا فِـرارًا منه**».

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) دەرچوو بەرەو شام، کاتێ گەیشتە گوندی (سەرغ) هەواڵی پێ گەیشت کە درم و نەخۆشی لە شام بڵاو بووەتەوە، عبدالرحمن ی کوڕی عەوف(ڕەزای خوای لێ بێت) هەواڵی پێدا کە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (ئەگەر بیستتان لە ناوچەیەکدا بڵاوبۆتەوە مەچنە ناوی، وە ئەگەر لە ناوچەیەکیشدا بڵاو بوو بووەوەو ئێوەش لەوێ بوون، ئەوا دەرمەچن و لێی هەڵ مەیەن.

وعن أبي هريرَةَ رضي الله عنه أنَّ رسولَ اللَّهِ(ﷺ) قال: «**لا يُورِدُ المُمْرِضُ على المُصِحِّ**». رواهما البخاري ومسلم.

واته: با خاوەنی ووشتری نەخۆش ووشترەکەی تێکەڵی ووشتری ساغی خەڵك نەکات.

### ٨- زۆر ئە نجامدانی کردەوەی چاکەو ئیحسان:

عَنْ أنسٍ (رضي الله عنه) قالَ: قال رسولُ اللهِ(ﷺ): ((**صنائعُ المعرُوفِ تقي مَصارِعَ السُّوءِ، والآفاتِ، والهَلَكَاتِ، وأهْلُ المعرُوفِ في الدُّنيا هُمْ أهلُ المعرُوفِ في الآخِرَةِ**)). رواه الحاكم.

واته: کردەوەی چاك دەبێتە هۆی پاراستننت لە مردنی ناخۆش و بەڵاو تیاچوون، وە ئەهلی چاکەخوازان لە دونیادا ئەهلی چاکە خوازین لە ڕۆژی دواییدا.

ابن القيم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی:
(ومِنْ أعْظَمِ عِلاجات المرضِ: فِعْلُ الخيرِ والإِحسان، والذِّكْرُ، والدُّعاءُ، والتَّضَرُّعُ، والابتهالُ إلى الله، والتَّوبةُ، ولهذه الأمور تأثيرٌ في دَفْعِ العِلَل، وحُصُولِ الشِّفاءِ" أعظمُ مِنَ الأدوية الطِّبيعيَّةِ، ولكن بحَسَبِ استعدادِ النَّفْس، وقَبُولِها، وعَقِيدتها في ذلك ونفعِه).
زاد المعاد.

واتە: لە گەورەترین چارەسەرەکان بۆ نەخۆشی: ئەنجامدانی کردەوەی چاك و زیکر و پاڕانەوەو کزۆڵی و لالأنەوەیە بۆ لای خوای گەورەو تەوبەو پەشیمانی دەربڕینە، ئەم شتانە کاریگەریان زیاترە لە دوور خستنەوەی نەخۆشی و شیفا وەرگرتن لە دەرمانە سروشتییەکان، بەلاَم

به پێی ئاستی ئامادەیی نەفس و وەرگرتنی و بیروباوەڕی بەمەو بە سوودەکانی.

## ٩- شەونوێژ:

عن بِلالٍ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ(ﷺ) قال: ((**عليكُمْ بِقيامِ اللّـَيْـلِ، فإِنَّـهُ دَأَبُ الصَّالِحينَ قَبلكُم، وإِنَّ قِيامَ اللَّيلِ قُربَـةٌ إلى اللهِ، ومَنْهاةٌ عنِ الإِثْمِ، وتكفِيرٌ للسَّيِّـئاتِ، ومَطْرَدَةٌ لِلدَّاءِ عنِ الجَسَدِ**)). رواه الترمذي وغيره.

واتە: شەونوێژ ئەنجام بدەن، چونکە ڕەوشتی پیاوچاکانی پێش ئێوەیە، وە شەونوێژ نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورەو دوور کەوتنەوەیە لە

تاوان و سڕینەوەی گوناهەکانەو دوورخەرەوەی نەخۆشییە لە لاشە.

## ١٠- داپۆشینی دەفرو قاپ و بەستنی دەمی کوندەو مەشکە :

عن جابرِ بنِ عبدِ اللَّهِ (رضي الله عنهما) قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) يَقُولُ: ((**غَطُّوا الإِناءَ، وأَوكُوا السِّقاءَ، فإِنَّ في السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فيها وباءٌ، لا يَمُرُّ بإِناءٍ ليسَ عليهِ غِطاءٌ، أو سِقاءٍ ليس عليه وِكاءٌ إِلا نَزَلَ فيه مِنْ ذلك الوَباءِ**)). رواه مسلم.

واتە: سەری دەفرو قاپەکان دابپۆشن، وە سەری مەشکەو کوندەکان ببەستن، چونکە لە ساڵدا

شەویْك هەیە درم و نەخۆشی دادەبەزێت: بە لای هیچ دەفریْکدا تیّ ناپەڕێت کە سەری دانەپۆشرابێت، یان خواردنەوەیەك دەمەکەی دانەخرابێت، ئیلا لەو درمە دەچێتە ناویەوە.

ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) فەرمویەتی: (وهذا مِمَّا لا تَنالُـهُ علومُ الأطِبَّاء ومعارِفُهُم). زاد المعاد

واتە: ئەمەش لەو شتانەیە کە زانست و زانیاری پزیشکان پێی ناگات.

**لە کۆتاییدا**: لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە کارەکانی بسپێرێت بە خوای گەورە، ئومێدی بە فەزڵی ئەو بێت، تەماعی بە پشتیوانی ئەو بێت، پشتی بەو ببەستێت، چونکە

هەموو شتەكان بەدەستی ئەوەو گوێڕایەڵی بڕیارو فەرمانی ئەوە.

وە پێویستە كۆشش بكات لە وەرگرتنی ئەو شتەی لە موسیبەتەكان ڕزگاری دەكات بە ئارامگری و ئومێدی پاداشتەوە، چونكە خوای گەورە بەڵێنی پاداشتێكی زۆری داوە بەوانەی ئارامگرن و چاوەڕوانی پاداشتن، وەك فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾. الزمر: ١٠.

واتە: بێ گومان تەنها دان بەخۆدا گران بێ ژمارە پاداشتیان دەدریتەوە.

وعن عائشةَ (رضي الله عنها) أنها سألت النبيَّ(ﷺ) عن الطَّاعون، فقال: «**إِنَّه كان عذابًا**

يَبْعَثُهُ اللهُ على مَن يشاءُ، فجَعَلَهُ اللهُ رحمةً للمُؤمنينَ، فليس مِنْ عبدٍ يَقَعُ الطاعون، فيَمْكُثُ في بلدِه صابرًا، يَعْلَمُ أنَّه لن يصيبَهُ إلا ما كَتَبَ اللهُ له، إلا كان له مِثْلُ أجْرِ الشَّهيدِ)). أخرجه البخاري.

واته: عائيشه(ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری له پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد دەربارەی تاعون، ئەویش فەرمووی: ئەوە سزایەك بوو خوای گەورە دەینێرێت بۆ هەر کەسێك ویستی لێ بێت، وە خوای گەورە دەیکاتە ڕەحمەت بۆ ئیمانداران، هیچ بەندەیەك نییە توشی تاعون ببێت و له شارەکەی خۆیدا بمێنێتەوەو ئارامگربێت، باش بزانێت که به دڵنیاییەوە هیچ شتێکی توش نابێت ئیلا ئەوە نەبێت که خوای گەورە لەسەری

نوسیوە، ئیلا پاداشتی هاووێنەی شەهیدی بۆ هەیە.

وە داواکارم لە خوای گەورە هەمووومان تەوفیق بدات بۆ ئەوەی خۆی پێی خۆشەو لێی ڕازییە لە کردەوەی چاك و ووتەی جوان، چونکە خۆی هەق دەڵێت و ڕێنمویی دەکات بەرەو ڕێگای ڕاست.

والحمدُ لله وَحْدَه، وصلَّى الله على نبيِّنا محمد وآله وصحبه وسلم.